٧

# چل گوڵ

لەگوڵزاری فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

ئامادەکردنی

عمر عبدالعزيز



چاپی نۆیەم

2010

# چـــل گـــول

کۆکردنەوەو ڕاڤەکردنی
عمر عبدالعزیز

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: چل گول لەگولزاری فەرموودە

نوسینی: عمر عبد العزيز

دیزاین: ابراهيم معروف

چاپی: بیست ودووەم ٢٠١٠

ژمارەی سپاردنی ( ١٤٤ ) سالی ( ١٩٩٨ )ی وەزارەتی رۆشنبیری
حکومەتی هەریمی کوردستانی پیدراوە

# پیشەکی

لە سالی ١٩٩٢ز دا هەندێ لـە مامۆستایانو بـراو خوشـکانی دۆستی فەرموودەکانی پیغەمبـەر (ﷺ) داوایـان لـی کـردم کـە چـل فـەرموودە هەلبـژیرمو واتایـەکی کورتیـان بکـەم، بـۆ تامـەزرۆیانی گـولزاری (حـدیث)و فـەرموودەکانی پیغەمبـەر (ﷺ) بەمەبەسـتی خوینـدنو لەبـەرکردنیان لەلایـەن ئەوانـەوە کەلـە وانـە گشـتیو تایبەتیەکاندا پیویسـتیان بـوو ئاشـنابن بەلایـەنی ژیاننامـەو فـەرموودەو ئاراستەکانی ئەو سـەروەرە بەنـدەش چـل فـەرموودەم هەلبـژارد هـەر فەرموودەیەك بۆ بواریك و، کورتە واتایەکم کردن، هینـدەی یارمـەتی مامۆستایانی وانەبیـژ یـان راڤـەکاری فـەرموودە بـداتو، ئـەوی تـرم جیٚهیشت بۆ مامۆستایانی بەریز، کە وانەو پەندو ئامۆژگاری پیویسـت لەو فەرموودانە دەربینن بۆ دۆستانی فەرموودە.

لەوکاتەوە بەسوپاسەوە دەیان جار ئـەو نامیلکەیـە بـەناوی ﴿چـل گولّ لەگولزاری فـەرموودەکانی پیغەمبـەر (ﷺ)﴾ بـەئاگاییو بـەبیٚ ئاگایی بەندە لە هەولیرو لە سلیمانی لە چـاپ دراوە.. ئـەوەی بەنـدە ئاگام لی بیٚ تەنها لـە سـلیمانی نزیکـەی (٢٠) جـار چـاپ کـراوەو تیراژی چاپی ئەم نامیلکە بەبەرەکەتە لەدەیان هەزار تیٚپـەریوەو، تـەنها لەلایەن ناوەندی رۆشنبیرەوە سنوری (٥٠) هـەزار دانـەی لـی چـاپ

کراوەو، خوای گـەورە وەری گـرێ لــە هـەزاران مـاڵو قوتابخانـەی مزگەوتیو پۆلی شەیدایانی فەرموودەدا سودیان لـی بینراوە....

لەم دواییانەدا کەوتمە بیری ئەوەی کە پیاندا بچـمەوەو، لــەرووی (سەنەد)و (مەتن)ەوە بەووردی بگەڕیمەوە بۆ سەرچاوە سەرەکیەکان.

هیوادارم سودو بەرەکـەتی ئـەم فەرموودانـە بـەردەوام بـێو، بیسـەرو خوینەران بەگشتی بێ بەشمان نەکەن لە دوعای خیـرو داوای پاداشـتی خوایی.

عمر عبدالعزیز

٢٠٠٩ م

**فەرمودەی یەكەم: عن علي بن أبو طالب (رضي الله عنه) عـن رسـول الله (صلى الله عليه وسلم) قـال: ﴿خيركم من تعلم القرآن وعلمه﴾[1].**

**باشـترینتان ئەو كەسـەیە كـە قورئـان فێـر دەبـی و كەسـانی تریش فێر دەكات.**

**فەرموودەی دووەم: عن أبي ذر (رضي الله عنه) قـال: قـال لـي رسـول الله (صلى الله عليه وسلم): ﴿اتق الله حيثما كنت و أتبع السيئة الحسنة تمحها و خالق الناس بخلق حسن﴾[2].**

**لە هەر كات و حالەتێكدا بووی لـە خـوا بترسـە و پارێزگار بە... بە شوێن هەڵە و تاواندا چاكە بكە، تا بیسڕێتەوە، لەگەڵ خەڵكیدا بە رەوشتی جوان هەڵس و كەوت بكە.**

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە:(صحيح البخاري) كتاب فضائل القرآن، باب ٢١، بەژمارە ٥٠٢٧، ٥٠٢٨. (سنن أبي داود) كتاب الوتر، باب ١٤، بەژمارە ١٤٥٢. (جامع الترمذي) كتاب فضائل القرآن، باب ١٥، بەژمارە ٢٩٠٩. (سنن إبن ماجه) كتاب مقدمة الأحاديث، باب ١٠٦ بەژمارە ٢١١، ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (جامع الترمذي) كتاب البر والصلە، باب ٥٥، بەژمارە ١٩٨٧، بەسەنەدی (صحيح) هەروەها (حاكم)یش بە (صحيح)ی داناوە.

**فەرموودەی سی یەم: عن أنس بن مالك (ﷺ) عن رسول الله (ﷺ) قال:** ﴿لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده و أهله و ماله والناس أجمعين﴾[١].

**سویند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە هیچ کەس لە ئیوە ئیمانی نی یە تاوەکو منی لە خۆی و کەس و کاری و هەموو خەلکی خۆشەویست تر نەبم لە لای.**

**فەرموودەی چوارەم: عن عبدالله بن عمر (ﷺ) عن رسول الله (ﷺ) قال:** ﴿المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده﴾[٢].

**موسلمان ئەو کەسەیە کە موسلمان لە زمانی و دەستی بی وەی بن.**

---

[١] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) كتاب الإيمان، باب ٧، بەژمارە ١٣و ١٤. (صحيح مسلم) كتاب الإيمان، باب ١٧ بەژمارە ٤٥. ئەم فەرموودەیە (صحيح) ە.

[٢] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) كتاب الإيمان، باب ٤، بەژمارە ١٠و١١و ٦٤٨٤. (صحيح مسلم) كتاب الإيمان، باب ١٤، بەژمارە ٤١و٤٢. ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە.

**فەرموودەی پێنجەم: عن أم الدرداء (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ):** ﴿دعوة المرء المسلم لأخيه بظهر الغيب مستجابة عند رأسه ملك موكل كلما دعا لأخيه بخير قال الملك الموكل به آمين ولك بمثل﴾[1].

**دوعای مرۆڤی موسلمان بۆ برای موسلمان، لە پاشملە، لای خوا قبوولە. لای سەری ئەو کەسە فریشتەیەك راسپێرراوە کە هەر کات دوعای خێری کرد بۆ براکەی، فریشتەکە دەڵێت: آمین.. واتە خوایە ئەم دوعایە قبوول کا، وێنە و هاوتای ئەو دوعایەش خێر بۆ خۆت بنوسرێ.**

**فەرموودەی شەشەم: عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ):** ﴿ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش ولا البذيء﴾[2].

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) كتاب الذكر والدعاء، باب ٢٣، بەژمارە: ٢٧٣٣. (سنن ابن ماجه) كتاب المناسك، باب ٢٥ بەژمارە ٢٨٩٥ بەسەنەدی (صحيح).

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (مسند أحمد بن حنبل) لە (مسند)ی عبدالله بن مسعود، بەژمارە ٣٨٣٩. (جامع الترمذي) كتاب- البر والصلة، باب ٤٨، بەژمارە ١٩٧٧، بەسەنەدی (حسن غريب)، بەڵام (حاكم) بە (صحيح)ی داناوە. پێشەوا (بخاري)ش لە (تأريخ)ەکەیدا هێناویەتی. (صحيح ابن حبان) كتاب الإيمان، باب ٤، بەژمارە ١٩٢.

بروادار تانەو تەشەر ليدەر و لەعنەت و نەفرينكەر و جوين دەر و دەم پيش نی يە.

**فەرموودەی حەوتەم: عن أبی هريره (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليصل رحمه ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت﴾[1].**

هەركەس بروای بە خوا و پاشەرۆژ هەيە، با ريزی ميوانی بگريت، هەر كەس بروای بە خواو پاشەرۆژ هەيە باسيلەی رەحم بەجی بينيت و ئاموشۆی خزم و نزيكانی بكات، هەركەس بروای بە خواو پاشەرۆژ هەيە، با قسەی چاك بكات يان بی دەنگ بيت.

---

[1] ئەم فەرموودەيە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) كتاب الأدب، باب ٨٥، بەژمارە ٦١٣٨، هەروەها لەچەندين جيی تری هەمان سەرچاوەدا هاتووە. (صحيح مسلم) كتاب الإيمان، باب ١٩، بەژمارە ٤٧و ٤٨ بەكەمێ جياوازی يەوە. سەنەدی ئەم فەرموودەيە (صحيح)و دروستە.

**فەرمودەی هەشتەم: ( همام )ی کوری ( حارث ) دەڵێ: لەگەڵ ( حذیفة ) لەمزگەوتدا دانیشتبووین، پیاویک هات لەگەڵمان دانیشت، یەکێ بە ( حذیفة )ی ووت: ئەم پیاوە قسە کۆدەکاتەوە و دەیگێریتەوە بۆ پیاوانی دەسەڵات ( حذیفة )ش بە دەنگی بەرز ووتی: گویم لە پیغەمبەر بوو ( ﷺ ) فەرمووی: ﴿لا یدخل الجنة قتات﴾[1].**

واتە: قسەچی ناچیتە بەهەشت.. مەبەستی بوو کە ئەو پیاوە گوێی لێ بیت.

**ئەو کەسەی کە گوێ بۆ قسەی خەڵکی هەڵدەخاو قسە چنی دەکات، ناچیتە بەهەشتەوە.**

**فەرموودەی نۆیەم: ئەنەسی کوری مالك دەڵێ: پیاویکی پیر هاتو ویستی بچیتە خزمەتی پیغەمبەر ( ﷺ ) ، خەڵکەکە بەسستی لەگەڵی جوڵانەوە، بەخیرایی ڕییان بۆ نەکردەوە، پیغەمبەر ( ﷺ )**

---

[1] ئەم فەرمودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) کتاب الأدب، باب ٤٩ بەژمارە ٦٠٥٦و ٢١٦. (صحیح مسلم) کتاب الإیمان، باب ٤٥، بەژمارە ١٠٥.

- کەئەوەی بینی- فەرمووی: ﴿ليس منا من لم يرحم صغيرنا و لم يوقر كبيرنا﴾[1].

لە ئیمە نی یە کەسیك بۆ بچوکمان سۆز نەنوینی و ریزی گەورەمان نەگری. واتە لەسەر رەویەی پیغەمبەر و ئوممەتی ئیسلام نییە.

**فەرموودەی دەیەم: عن أنس بن مالك (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ﴿لا تباغضوا ولا تقاطعوا ولا تحاسدوا ولا تدابروا وكونوا عباد الله إخوانا﴾[2].**

یەکتری مەبوغزینن و (رقتان لەیەکتری نەبیت)، پەیوەندیتان پیکەوە مەپچرینن، بەیەکتر ئیرەیی و حەسوودی مەبەن. پشت لەیەکتری هەلمەکەن و (ئاگاتان لەیەکتری بیت)، هەمووتان بەندەی خواو برای یەکتری بن.

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (جامع الترمذي) (كتاب البر والصلة)، باب ١٥، بەژمارە ١٩١٩. هاوشیوەش لە (مسند أحمد بن حنبل)دا بەژمارە ٢٣٢٩ هاتووە. ئەلبانی دەلێ: ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) كتاب الأدب، باب٥٧، بەژمارە ٦٠٦٥. (صحيح مسلم) كتاب البر والصلة، باب ٧، بەژمارە ٢٥٥٩.

**فەرمودەی یازدەهەم: عن أبی هریـره (رضي الله عنه) قـال: قـال رسـول الله(ﷺ): ﴿آیـة المنـافق ثـلاث إذا حـدث كـذب وإذا وعـد أخلف وإذا اؤتمن خان﴾[1]، وفي رواية (وإذا خاصم فجر).**

**نیشـانەی (دوو ڕوو) سـی شـتە: کـاتی ی کـرد درۆ بکـات. کـاتی بـەلینی دا نەیباتـە سـەر. کـاتی سـپارەدەیەکی لا دانـرا خیانەتی تیدا بکات.**

**فەرمودەی دوازدەهەم: عن ابی هریره (رضي الله عنه) قـال: قـال رسـول الله (ﷺ): ﴿لا یسـتر عبـد عبـدا فـي الـدنیا إلا سـتره اللـه یـوم القیامة﴾[2].**

**هەرکەسیك عەیب وناتەواوی کەسیك لە دنیادا داپۆشیت، خوا لە پاشەڕۆژدا عەیب و ناتەواوی ئەو کەسە دادەپۆشیت.**

---

[1] ئەم فەرموودەیە لـەم سـەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) كتاب الأمان، باب ٢٤، بەژمارە ٣٤و ٤٥٩و ٣١٧٨. (صحیح مسـلم) كتاب الإمان، باب ٢٥، بەژمارە ٥٩.

[2] ئەم فەرموودەیە لـەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح مسلم) كتاب البر والصلة، باب ٢١، بەژمارە ٢٥٩٠.

**فەرمودەی سیزدەهەم:** عەبدوڵای کوری عمر دەڵێ: پیاویك لــە پیغەمبــەر (ﷺ)ی پرســی: ﴿أي الإسلام خير قال تطعم الطعام وتقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف﴾[1].

**پیاویــك لــە پیغەمبــەری خــوای(ﷺ) پرســی: چ جــۆرە کردەوەیەکی موسلمانانە چاکترە؟ فرمووی: خۆراك ببەخشیت و سلاو بکەیت لەوەی کە دەیناسیت و لەوەش کە نایناسیت.**

**فەرمودەی چــواردەهەم: عــن ســالم عــن أبيــه (رضي الله عنه) أن رســول الله(ﷺ) قــال: ﴿من كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته ومن فرج عن مسلم كربة فرج الله عنه بها كربة من كرب يوم القيامة﴾[2].**

**هەرکەس خەریکی کاروباری برایەکی بیت خوا کاروباری بۆجی بەجی دەکات، هەرکەس نارەحەتییەك لەسەرموسلمانیك لابەریت، خوابەوهۆیەوەنارەحەتییەکی رۆژی دوایی بۆلادەبات.**

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري)، كتاب الأيمان، باب ١٤، بەژمارە ١٢، هەروەها بەژمارە ٢٨و ٦٢٣٦ دووبارە بوونەتەوە. (صحيح مسلم) كتاب الإيمان، باب ١٤، بەژمارە ٣٩.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب المظالم)، باب ٢، بەژمارە ٢٤٤٢. (صحيح مسلم) (كتاب البر والصلة)، باب ١٥، بەژمارە ٢٥٨٠.

**فەرمودەی پازدەهەم: عن عبدالرحمن بن أبی بکرة، عـن أبیـه، قال: قـال نـبی (ﷺ):** ﴿الا أنبئكم باكبر الكبائر ثلاثا قلنا بلى يا رسول الله قال الإشراك بالله وعقوق الوالدين وكان متكئا فجلس فقال ألا وقول شهادة الزور فما زال يكررها حتى قلنا ليته سكت﴾[١].

**ئایـا لـە گـەورەترینی گوناهـەکان ئاگادارتـان بکەمـەوە؟ وتمان: بەلی ئەی پیغەمبەری خـوا. فەرمووی: هـاوەل بریاردان بـۆ خـوا. سەرپیچی کردنـی فـەرمانی دایـك و بـاوك (لـەو کاتـەدا شـانی دادابـوو پاشـان دانیشـت و فـەرمووی): ئاگـادار بـن! گەواهی دان و شـایەتی درۆش...لەم کاتـەدا کە پیغەمبەر(ص) شانی دادابوو، هەستاو دانیشت و هیندە فـەرمووی ئاگاتـان لـە شایەتی درۆبی، تاوەکو وتمان: خۆزگەئەوەی ئەوەندە دووبارە نەدەکردەوە.**

[١] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) (کتاب الشهادات)، باب ١٠، بەژمارە ٢٦٥٤، هەروەها لە: ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٩١٩ دووبارە بوەتەوە. (صحیح مسلم) کتاب الإیمان، باب ٣٨، بەژمارە ٨٧.

**فەرمودەی شازدەهەم: عن إبن عمر (رضي الله عنه) قــال: أخـذ رسـول الله بمنكبي فقال:** ﴿كن في الدنيا كأنك غريب أو عابر سبيل﴾[١].

**عبـدالله دەلـی: پیغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) شـانی گـرتم و فـەرمووی: لـە دنیادا وەکو غەریبیك یان ریبواریك بژی.**

**فـەرمودەی هەفدەهـەم: عـن صـهیب (رضي الله عنه) قــال: قــال رسـول الله (صلى الله عليه وسلم):** ﴿عجبا لأمر المؤمن لا يقضي الله قضاء إلا كان خيرا له ... وإن أصابته ضراء صبر فكان خيرا له إن أصابته سراء شكر فكان خيرا له﴾[٢].

**حـالی بـڕوادار زۆر جیـی سەرسـورمانە، خـوا هەرچـی بـۆ بڕیار دەدا بە خیری تەواو دەبیت، ئەگەر ئازار و نارەحەتی پـی گەیشت خۆی رادەگری و صەبر دەکا و سەئەنجام دەبی بەخیر بۆی. ئەگەر خۆشی و شادییەکیشی پی گەیشت سوپاسی خوا دەکات و سەرئەنجام ئەوەش دەبیتە خیر بۆی.**

---

[١] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) كتاب الرقاق، باب ٣، بەژمارە ٦٤١٦. (سنن الترمذي) كتاب الزهد، باب ٢٥، بەژمارە ٣٣٣. هەروەها (سنن ابن ماجة) بەژمارە ٤١١٤.

[٢] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) (كتاب الزهد والرقائق)، باب ١٣، بەژمارە ٢٩٩٩. (صحيح ابن حبان)، (كتاب الرقائق)، باب٦، بەژمارە ٧٢٨، (بەشیك لە فەرموودەکەی تیدا هاتووە).

**فەرمودەی هەژدەهەم: عن أبی ذر (رضي الله عنه) قال: قال لی النبی (ﷺ): ﴿لا تحقرن من المعروف شيئا ولو أن تلقى أخاك بوجه طلق﴾[1].**

**لە كاری چاك و پەسەند هیچ شتێك بە بێنرخ سەیر مەكە، ئەگەر ئەوەش بێت كە بەروویەكی خۆش و كراوەوە رووبەرووی براكەت ببی.**

**فەرمودەی نۆزدەهەم: عن أبی هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿انظروا إلى من هو أسفل منكم ولا تنظروا إلى من هو فوقكم فإنه أجدر أن لا تزدروا نعمة الله عليكم﴾[2].**

**سەیری لەخۆتان بەرەو خوارتر بكەن و مەروانن بەرەو ژوورتر لە خۆتان، ئەمە شیاوترە بۆ ئەوەی كە بە بێ نرخانە سەیری ئەو نیعمەتانە نەكەن و بەكەمیان نەزانن كە خوا پێی بەخشیون.**

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) (كتاب البر والصلة)، باب ٤٣، بەژمارە ٢٦٢٦. (سنن أبي داود) (كتاب الباس)، باب ٢٥، بەژمارە ٤٠٨٤. (سنن الترمذي) بەژمارە ٢٧٢٢.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) (كتاب الزهد والرقائق)، بەژمارە ٢٩٦٣. لە (صحيح البخاري) یشدا بەژمارە ٦٤٩٠ فەرموودەیەكی نزیك لەمە هاتووە.

**فەرمودەی بیستەم:** عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: ﴿من رد عن عرض أخيه رد الله عن وجهه النار يوم القيامة﴾[1].

هەرکەس لە ناموسی برایەکی پشتگیری بکات، خوا لە پاشەرۆژدا ئاگر لە رووی دوور دەخاتەوە.

**فەرمودەی بیست و یەکەم:** عن النواس بن سمعان الأنصاري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): ﴿البر حسن الخلق والإثم ما حاك في صدرك وكرهت أن يطلع عليه الناس﴾[2].

چاکەی زۆر رەوشت جوانی یە، گوناهیش ئەوەیە کەلەدلتا خورتە خورت بکا و پیت ناخۆش بیت خەلکی پی ی بزانیت.

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (سنن الترمذي) (كتاب البر والصلة)، باب ٢٠، بەژمارە ١٩٣١. بەسەنەدی صحیح.. هەروەها پیشەوا ئەحمەدو نەسائی بەسەنەدی (حسن) گیراویانەتەوە.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) (كتاب البر والصلة والآداب)، باب٥ بەژمارە ٢٥٥٣. (سنن الترمذي) (كتاب الزهد)، باب ٥٢، بەژمارە ٢٣٨٩. هەروەها (بخاری) (الأدب المفرد) دا گیراویەتەوە. (صحيح ابن حبان) (كتاب البر الإحسان)، بەژمارە ٣٩٧. (مسند أحمد) بە ژمارە ١٧٨٣. (الحاكم) بەژمارە (١٤١٢) گیراویەتەوە

**فەرمودەی بیستو دووەم: عن أبی هریرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ما أذن الله لشيء ما أذن للنبي أن يتغنى بالقرآن﴾[١].**

**لەریوایەتیکی تردا: ﴿لنبي حسن الصوت يجهر به﴾.**

**خوا مۆڵەتی نەداوە بۆ هیچ شتیك هەروەکو مۆڵەتی داوە بە پیغەمبەریکی دەنگ خۆش کە بە ئاوازەوە و بە دەنگی ئاشکرا قورئان بخوینیتەوە.**

**فەرمودەی بیستو سی یەم: عن ابن عباس (ﷺ) یقول: سمعت النبي یخطب یقول: ﴿لا يخلون أحدكم بامرأة إلا ذي محرم﴾[٢].**

**هیچ کەس لەئیوە لەگەل ئافرەتیکدا گۆشەگیرنەبی و لە شوینی چۆڵدا لەگەلی کۆ نەبیتەوە، مەگەر لەگەل کەسیکی مەحرەم دا.**

---

[١] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) (کتاب فضائل القرآن)، باب ١٩، بەژمارە ٥٠٢٣ و ٧٤٨٢. (صحیح مسلم) (کتاب المسافرین)، باب ٣٤، ژمارە٧٩٢.

[٢] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) (کتاب جزاء الصید)، باب ٢٦، بەژمارە ١٨٦٢و ٣٠٠٦و ٥٢٣٣. (صحیح مسلم) (کتاب الحج)، باب ٧٤، بەژمارە ١٣٤١.

**فەرمودەی بیست و چوارەم: عن ابن عباس (رضي الله عنه) قال: قال النبي (صلى الله عليه وسلم):** ﴿نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس الصحة والفراغ﴾[١].

دوو نیعمەت زۆر کەس تیایدا خەسارەتمەند و دۆڕاون: تەندروستی و بیکاری و فەراغەت. (واتە ناتوانن بە شیوەی شیاو و تەواو سوود لەو دوو نیعمەتە وەربگرن).

**فەرمودەی بیست و پینجەم: عن أبی هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم):** ﴿المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير احرص على ما ينفعك واستعن بالله ولا تعجز وإن أصابك شيء فلا تقل لو أني فعلت كان كذا وكذا ولكن قل قدر الله وما شاء فعل فإن لو تفتح عمل الشيطان﴾[٢].

بڕواداری بەهیز و بازوو، باشتر و خۆشەویست ترە لای خوا لە بڕواداری لاواز، بەلام لە هەردوو لایاندا خیر و چاکە هەیە. سوور بە لەسەر ئەو شتەی کە سوودت پی دەگەیەنی و بە خوا پشت ببەستە و لاوازی مەنوینە. ئەگەر شتیکت تووش

---

[١] ئەم فەرمووده‌یە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب الرقائق)، باب ١، فەرموودەی ژمارە ٦٤١٢.

[٢] ئەم فەرمووده‌یە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم)، (كتاب البر)، باب ٨، فەرموودەی ژمارە ٢٦٦٤.

هات مەلی: ئەگەر واو وام بكردایە واو و وا دەبوو، بەلكو بلی: خوا وای بریارداوە و هەرچییش خۆی مەیلی بی دەیكا، چونكە وشەی (ئەگەر) دەرگای وەسوەسە بۆ شەیتان دەكاتەوە.

**فەرمودەی بیست و شەشەم: عن أبي سعيد (رضي الله عنه) و ابی هريرە( رضي الله عنه ) أنهما سمعا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول:** ﴿ما يصيب المسلم من نصب ولا وصب ولا هم ولا حزن ولا أذى ولا غم حتى الشوكة يشاكها إلا كفر الله بها من خطاياه﴾[1].

هەرچییەك كە تووشی موسلمان دیت لە ماندووی و نارەحەتی ومەراق وخەفەت و ئازار و خەم، تەنانەت دركیكیش كەبە پیی دا دەچیت خوا بەو شتانە لە گوناهی هەلدەوەرینیت.

**فەرمودەی بیستو حەوتەم: عن أبي بردة الأسلمي (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم):** ﴿لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتى يسأل عن عمره فيما أفناه وعن علمه فيم فعل وعن ماله من أين اكتسبه وفيم أنفقه وعن جسمه فيم أبلاه﴾[2].

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب المرضى)، باب ١، فەرموودەی ژمارە: ٥٦٤١و ٥٦٤٢. (صحيح مسلم) (كتاب البر والوصلة و الآداب)، باب ١٤، فەرموودەی ژمارە ٢٥٧٣.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (جامع الترمذي)، (كتاب صفة القيامة)، باب١،فەرموودەی ژمارە ٢٤١٧.

دوو پێی هیچ بەندەیەك لە پاشەڕۆژدا ناترازێت تا لە چوار شت پرسیاری لێ نەكرێت: لە تەمەنی: كە لە چیدا بەسەری بردووە، لە عیلم و زانستی: كە لە چیدا بەكاری هێناوە، لە سامانی: كەلە كوێوە پەیدای كردووە و لە چیدا بەخشیویەتی، لە لاشەی: كە لە چیدا تاقی كردووەتەوە.

**فەرمودەی بیست و هەشتەم: عن سعيد بن أبي بردة بن أبـى وسـى الأشعري عن أبيه عن جده، قال: قال النبي (ﷺ):** ﴿على كل مسلم صدقة، قالوا فإن لم يجد؟ قال: يعمل بيديه فينفع نفسه ويتصدق، قالوا: فإن لم يستطع؟ قال: فيعين ذا الحاجة الملهوف، قالوا: فإن لم يفعل؟ قال: فيأمر بالخير أو قال بالمعروف، قال: فإن لم يفعل؟ قال فيمسك عن الشر، فإنه له صدقة﴾[1].

هەموو موسلمانێك خێركردنی لەسەرە، وتیان: ئەی ئەگەر نەیبوو؟ فەرمووی: بەدەستی خۆی ئیش بكات و سوود بە خۆی و غەیری خۆی بگەیەنی، وتیان: ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی:یارمەتی خەلكی لیقەوماوی موحتاج بدات، وتیان:

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب الزكاة، باب ۳۰، بەژمارە ۱٤٤٥و (كتاب الأدب)، باب ۳۳، بەژمارە ٦٠۲۲. (صحيح مسم) (كتاب الزكاة) ، باب ١٦، بەژمارە ١٠٠٨.

ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: فەرمان بە چاکە یان خێر بکات، وتیان: ئەی ئەگەر نەیکرد؟ فەرمووی: خۆی بگری لە خراپەکردن، ئەوە خۆی چاکە کردن (صدقە) یە.

**فەرمودەی بیست و نۆیەم: عن أبي هريرة(ﷺ) عن النبي(ﷺ)**

**قال:** ﴿إن الدين يسر، ولن يشاد الدين أحد إلا غلبه، فسددوا وقاربوا وأبشروا واستعينوا بالغدوة والروحة وشيء من الدلجة﴾[1].

بەراستی ئایائاسان و ئاسانکارییە ، هەرکەس لەگەل ئایین دا توند بی و بگرە و بەردە بکات، ئایا بەسەریدا زال دەبی، لەبەر ئەوە میانە رەو بن و زیاد و کەم مەچن وە تا دەکری لەو خالە نزیك ببنەوە.گەشبین و مژدەدەربن. پشت ببەستن بە کاتە گرنگەکان بۆ کار و چالاکی (وەك موسافیریك بکە کە بەرە بەیان و عەسران و بەشی لە شەو ری دەکات و، ناشوەستی و خۆشی ماندوو ناکا و، لەسەر خۆ گەشتەکەی دەکا.

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) کتاب الإیمان، باب ٢٩، بەژمارە ٣٩،لەچەند جیەریکی تریش بەکەمێ جیاوازی دووبارەبۆتەوە.

**فەرمودەی سی یەم: عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول:** ﴿إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم﴾[1].

بەراستی برواداری بەرەوشت جوانی دەگاتە پلەی کەسیکی رۆژووگری شەوبیدار(واتە ئەوکەسەی هەمیشە ئەوە کاریەتی).

**فەرمودەی سی و یەکەم: عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رجلا قال للبني(ﷺ): أ وصني،** ﴿فقال لا تغضب﴾[2].

پیاویك هاتە خزمەت پیغەمبەری خوا و عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خوا! ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی: تووڕە مەبە.

**فەرمودەی سی و دووەم:** ﴿أيها الناس إن الله طيب لا يقبل إلا طيبا وإن الله أمر المؤمنين بما أمر به المرسلين فقال ﴿ يا أيها الرسل كلوا من الطيبات واعملوا صالحا إني بما تعملون عليم ﴾، وقال: ﴿ يا أيها

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (سنن أبي داود) (كتاب الأدب)، باب ٧، بەژمارە ٤٧٩٨، هەروەها (ابن حبان) لە صەحیحەکەیداو (حاکم) یش گیراویانەتەوە.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب الأدب)، باب ٧٦، بەژمارە ٦١١٦. (جامع الترمذي) كتاب البر والصلة، باب ٧٣ بەژمارە ٢٠٢٠.

الذين آمنوا كلوا من طيبات ما رزقناكم ﴾، ثم ذكر الرجل يطيل السفر أشعث أغبر يمد يديه إلى السماء يا رب يا رب ومطعمه حرام ومشربه حرام وملبسه حرام وغذي بالحرام فأنى يستجاب له﴾[1].

ئەی خەلکینە بە راستی خوا خاوینە و هەرچی خاوین نەبیت وەری ناگریت، بەراستی خوا ئەو فەرمانەی کە بەسەر پیغەمبەرانی داوە بەسەر موسلمانیشدا داوە، فەرموویەتی: ئەی پیغەمبەران لە شتە پاك و خاوینەکان بخۆن و کاری چاکە بکەن، هەروەها فەرموویەتی: ئەی بروادارآن لەو شتە پاك و خاوینانەی کە پیمان داوە بخۆن، پاشان پیغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کەسیکی کردکەلەسەفەردا زۆری پیدەچی وسەروپرچی هاتوە و تەپ و تۆزاوییە و دوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە و (دەلی): ئەی پەروەردگارم! ئەی پەروەردگارم! لە کاتیکداکەخواردن و خواردنەوەی حەرامە و بە حەرام تیرکراوە هەروەها جل و بەرگی حەرامە و بە حەرام پەیدای کردووە، ئیتر چۆن پارانەوەی گیرا دەبی و چۆن وەلامی دەداتەوە.

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) (كتاب الزكاة)، باب ١٩، بەژمارە ١٠١٥.

**فەرمودەی سی و سی یەم: عن أبي هريرة (ﷺ) أن النبي (ﷺ) قال:** ﴿ما من يوم يصبح العباد فيه إلا ملكان ينزلان فيقول أحدهما: اللهم أعط منفقا خلفا، ويقول الآخر: اللهم أعط ممسكا تلفا﴾[1].

هیچ شەوی رۆژ لە بەندەكانی خوا نابیتەوە مەگەر دوو فریشتە دینە خوارەوە و یەكیكیان دەلیت: خوایە هەركەس سامانی دەبەخشیت و (صدقە) دەكات مالی تری پی بدە، ئەوەی تریشیان دەلیت: خوایە! هەركەس دەستی نوقاندووە و لە دارایی خۆی نابەخشی، مالەكەی لە نیوبەرە و بیفەوتینە.

**فەرمودەی سی و چوارەم: عن الحارث بن سويد (رض) قال: قال يا عبدالله بن مسعود (رض) قال النبي (ﷺ):** ﴿أيكم مال وارثه أحب إليه من ماله؟ قالوا: يا رسول الله ما منا أحد إلا ماله أحب إليه، قال: فإن ماله ما قدم ومال وارثه ما أخر﴾.

كی لە ئیوە مالی میرات بەرەكەی لە مالی خۆی لە لا خۆشەویست ترە وتیان: ئەی پیغەمبەری خوا! هەموومان مالی خۆمان لە لا خۆشەویست ترە، فەرمووی: دەی بەراستی كەس

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب الزكاة)، باب ٢٧، فەرموودەی ژمارە: ١٤٤٢. (صحيح مسلم) (كتاب الزكاة)، باب ١٧، فەرموودەی ژمارە: ١٠١٠.

مالی خۆی ئەوەیە کە پێشی خۆی خستووە و بەخشیویەتی و مالی میرات بەرکەی ئەوەیە کە هێشتویەتیەوە. (چونکە بۆ ئەو بەجی دەمێنیت!).

**فەرمودەی سی و پێنجەم: عن عطیة السعدي(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ):** ﴿لا يبلغ العبد أن يكون من المتقين حتى يدع ما لا بأس به حذرا لما به البأس﴾[1].

بەندەی خوا ناگاتە رادەیەك کە بچیتە ریزی لە خوا ترسان و (متقی) یەکان، تاواز لەو شتانە بینیت کە لە رووی شەرعی یەوە گیر و گرفتیان لەسەر نی یە لە ترسی ئەوەی کە نەبی بە تووشی ئەو شتانەوە کە لە رووی شەرعی یەوە پەسەند نین.

**فەرمودەی سی و شەشەم: عن عقبة بن عامر (ﷺ) أن رسول الله(ﷺ) قال:** ﴿إياكم والدخول على النساء فقال رجل من الأنصار يا رسول الله أفرأيت الحمو قال الحمو الموت﴾[2].

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (جامع الترمذي) (كتاب صفة القيامة والرقائق والورع)،باب ١٩، بەژمارە ٢٤٥١، بەسەنەدی (حسن غریب). (سنن ابن ماجه) (كتاب الزهد)، باب ٢٤، بەژمارە ٤٢١٥. هەروەها (حاكم) گیراویەتەوە.

[2] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح البخاري) (كتاب النكاح)، باب ١١١، بەژمارە ٥٢٣٢. (صحيح مسلم) (كتاب سلام)، باب ٨، بەژمارە ٢١٧٢.

واته: خۆتان لەچوونە لای ئافرەتان (بە تەنیایی) بپارێزن، پیاوێك لە یاریدەران فەرمووی: ئەی خزمی نزیکی ژن بۆ پیاوەکەی یا بە پیچەوانەوە (واتە مالە خەزوورانی هەردوولا بۆ یەکتر وەکو ژن خوشك بۆ پیاو، یا هیوەر بۆ ژن، حوکمی چۆنە؟) فەرمووی: ئەوە هەر مەرگە. (واتە مەرگ لەو کارە چاك ترە، یا ئەو کارە مرینەرە). دیارە ئەوە دەگەیەنیت کە حوکمەکەی توندترە، چونکە جیگەی گومان نییە و خەلکی تووش بوونی گوناه بە دوور دەزانن و، بەو هۆیەوە شەیتان زیاتر لە کەمیندایە و ئاسانترە و ئاسانتر زەفەر دەبا.

**فەرمودەی سی و حەوتەم: عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبي(ﷺ):** ﴿إذا أوى أحدكم إلى فراشه فلينفض فراشه بداخلة إزاره، فإنه لا يدري ما خلفه عليه، ثم يقول: باسمك رب وضعت جنبي، وبك أرفعه، إن أمسكت نفسي فارحمها، وإن أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين﴾[1].

---

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحیح البخاري) (كتاب الدعوات)، باب ١٣، بەژمارە ٦٣٢٠. (صحیح مسلم) (كتاب الذكر والدعاء)، باب ١٧، بەژمارە ٢٧١٤.

گەر کەسیکتان چووە ناو جیگای نووستن با جی و بانەکەی بتەکینیت، چونکە نازانی چی تیا بەجی ماوە (واتە دەگونجیت کە جانەوەریك یان شتیکی ئازار دەری تیدا بیت)،پاشان بلیت: بە ناوی تۆوە ئەی پەروەردگارم، راکشام و بە ناوی تۆشەوە هەلدەستمەوە. ئەگەر لەم نووستنەمدا گیانت کیشام رەحمم پی بکە و ئەگەر گیانیشت نەکیشام بەو شیوەیەی گیانی پیاوچاکانی خۆتی پی دەپاریزی، بیپاریزە.

**فەرمودەی سی و هەشتەم: عن عبدالله(ﷺ) قال: عن النبي(ﷺ) قال:** ﴿اللهم إني أسألك الهدى والتقى والعفاف والغنى﴾[1].

**ئەی خوایە ! بەراستی من رینومایی و لە خوا ترسان و داوین پاکی و قەناعەت و بی نیازی و بی ئیحتیاجی، هەر لە تۆ داوا ئەکەم.**

[1] ئەم فەرموودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (صحيح مسلم) (كتاب الذكر والدعاء)، باب ١٨، بەژمارە ٢٧٢١. (جامع الترمذي) (كتاب الدعوات)، باب ٧٣، بەژمارە ٣٤٨٩. (سنن ابن ماجه) (كتاب الدعاء)، باب ٢، بەژمارە ٣٨٣٢.

**فەرمودەی سی و نۆیەم: عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم):** ﴿من خاف أدلج، ومن أدلج بلغ المنزل، ألا إن سلعة الله غالية، ألا إن سلعة الله الجنة﴾[1].

**هەرکەسی بترسی (زوو و لە سەرەتای شەوی تەمەنیدا) دەکەویتە ری، وە هەرکەسیش زوو بکەویتە ری، دەگاتە مەنزل، ئاگادار بن! بەراستی کالای خوا گرانە، ئاگادار بن! کالای خوا بەهەشتە.**

**فەرمودەی چلەم: عن أبي هريرة(رضي الله عنه)، أن رسول الله(صلى الله عليه وسلم) قال:** ﴿بادروا بالأعمال سبعا: هل تنتظرون إلا فقرا منسيا، أو غنى مطغيا، أو مرضا مفسدا، أو هرما مفندا، أو موتا مجهزا، أو الدجال فشر غائب ينتظر، أو الساعة، فالساعة أدهى وأمر﴾[2].

**لە حەوت کار دا دەست پیشخەری بکەن، ئیوە جگە لەم حەوت شتە چاوەروانی چیتر دەکەن؟: یا هەژاری یەك کە شتتان لە بیر دەباتەوە. یا دەولەمەندییەك کە سەرکەشتان**

---

[1] ئەم فەرمودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (جامع الترمذي) (كتاب صفة القيامة)، باب ۱۸، بەژمارە ۲٤٥۰.

[2] ئەم فەرمودەیە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (جامع الترمذي) (كتاب الزهد)، باب۳، بەژمارە ۲۳۰٦.

دەکات. یا نەخۆشییەك کە ئەتانفەوتینیت. یا پیرییەك کە ئەتان خلافینیت. یا مردنیك کە ئەتان برینیتەوە. یا نەجال، کە خراپترین گوم بوویەکی چاوەروان کراوە. یا دوا رۆژ کە زۆر تالو ناسۆر ترە.

# کۆتایی

شەوی ٨/شوال ١٤٢٩، ٨/١٠/٢٠٠٨ لەشاری سلیمانی، گەرەکی باخان لەراڤەکردنی ئەم فەرموودانەبوومەوە... داوا کارم خوای گەورە بیخاتە بەرپاداشتی دوا رۆژو سوود بگەیەنن بە موسلمانان.

دواپەیڤم ئەوەیەکەفەرموودەکانی پیغەمبەر(ﷺ)(جوامع الکلم)ن، پرواتاو رەوانو چرن، دەکرێ ئەم واتاکردنە دەروازەیەك بێ بۆ بەرچاو روونی خوینەر.. ئەگەر پیکابیتم و واتاکان دروست بن لەخوای گەورەو بەخششی خۆیەتی، گەر هەلەو ناتەواویش بن لە بەندەوەیەو، داوای لیخۆش بوون لەخوا دەکەمو، لەهەموو حالەتەکاندا دواهەمین داوام حەمدو سوپاسی نەبراوەو شایانە بۆ خوای گەورەو میهرەبان.

